كەسايەتی
شخصية محمد
Personal Mohammed

# ساتێك بۆ ناسینی موحەممەد







لە هەڵبژاردەو ئامادەكردنی

م: ابوبكر تۆفیق
خاوەنی بڕوانامەی ماستەر لە دەرەوەی وڵات
بە پلەی نایاب ودووەم لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی

(ئەم پەڕتووكە وەك وەڵامدانەوەیەكی شارستانی و زانیستی وئەكادیمی بێلایەنانەی باسخوازی بوێرانە، بۆ دەم كووتكردنی هەر نەزان و ناحەزو دووژمن و دەمارگیرێك كە كوێرانە (چاو نووقانی) پڕو پاگەندەو سوكایەتی بكات دژ بە موحەممەد ﷺ و پەیامە پیرۆزەكەی)



# ساتێك بۆ ناسینی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)

لە هەڵبژاردەو ئامادەکردنی

م: ابوبكر تۆفیق

خاوەنی بڕوانامەی ماستەر لە دەرەوەی وڵات

بە پلەی نایاب ودووەم لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی

(ئەم پەڕتووکە وەك وەڵامدانەوەیەکی شارستانی و زانیستی وئەکادیمی بێلایەنانەی باسخوازی بوێرانە، بۆ دەم کووتکردنی هەر نەزان و ناحەزو دووژمن و دەمارگیرێك کە کوێرانە (چاو نووقانی) پڕو پاگەندەو سوکایەتی بکات دژ بە موحەممەدﷺ و پەیامە پیرۆزەکەی)



١٤٣٤هـ ٢٧١٢ ك ٢٠١٣م

ناوی کتێب : ساتێك بۆ ناسینی موحەممەد( صلى الله عليه وسلم)
بەرگێکی تایبەت بۆ دەرخستن و ناسیینی موحەممەد( صلى الله عليه وسلم)
ناوەرۆك : پێناسی کەسایەتی .
نووسەر : مامۆستا ابو بكر توفيق
دیزاین : سەنتەری مژدە
نۆرەی چاپ : چاپی دووەم
تیراژ : (١٠,٠٠٠) دانە
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت/هەولێر ٠٧٥٠٤٦٣٩٥٣١
ژمارەی سپاردن : (٩٨٥) ی پەرتووکخانەی گشتی هەولێر ساڵی ٢٠١٢ز



جا تۆی دڵسۆزو خوێن گەرم و خوا پێداویش هەوڵی گەیاندن وبلاّوکردنــەوەی بکــە بەهەرهۆیــەك کــە بــۆت لــە بــارەو بۆتدەکرێت، لە دەرئەنجامدا دەبێتە خاوەن هەمان پاداشت).

## پێشەکیەکی کورت

سوپاس وستایش بەهەق تەنها ڕەواو شیاوی خوایە، سەلاَت وسەلام لە سەرگیانی پاك و پیرۆزی موحەممەدﷺ و خێزان ومندالّ وخزمان و سەرجەم هاوەلاّن وتێکڕای موسوڵمانان بە درێژایی مێژوو تا دوایین مرۆڤ لەم گەردوونەدا.

لە دواتر ئەم پەرتووکە دانراوە بە داخوازی هەندێك لە دڵسۆز ودڵگەرم خۆبەختکار و خوا پێداوی شاری هەولێر خۆشەویست(خوابیپارێزێت)لە تێکڕای کوردستان.

جا لە ڕاستیدا ئێمە هەرچەندە بڵێن ناتوانین هەق ماڧ ڕەوای گەورەیی وپیرۆزی (موحەممەد) بدەین، لە کاتێکا کەهیچ کەس و مرۆڤێك بە ئەندازەی ئەم کەسە پیرۆزە ((موحەممەد) نووسینی لە سەرنەکراوەو ناکرێت هەتا دوونیا دوونیایە.

بەلاّم وەك نموونەی دڵۆپیی ئاوێك کەبە سەری دەرزی هەڵگیرێت ئەم نووسینەمان بۆ ناسینی پێغەمبەر هەڵبژاردووە، خوا خێری هەموو لایەك بنووسیّ وبداتەوە.

## بەشی یەکەم :

## بۆ ناسینی هەرکەسێك پێویستە بەگەڕێینەوە بۆ وتەکانی:

**لەوانە :**

**١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( لاتحقرن من المعروف ولو أن تلقى اخاك بوجه طليق ))[1]**

**واتە :- چاکە خواز بە تەنانەت گەر تەنها بە ڕووخۆشیش بێت بەرانبەر براکەت.**

**بەڕاستی بلاّو کردنەوەی خۆشی و شادی بۆ سەر لێوی هەژاران چاکەیەکی نەبڕاوەیە لە جیهانی دادپەروەریدا، ڕوو گرژی بەرامبەر خەڵکی کە ئیعلانکردنی شەڕە، دژوارە بەرامبەر خەڵکانی تر، بێکۆتاییە و خوا دەزانێت کۆتایی خۆت دەبێت .**

**لێرەدا فەرمانمان پێدەکات کە هەردەم چاکە کاربین ( بەپێی توانا) با تەنانەت بە ڕووخۆشی خەندییش بێت بەرانبەربرای موسوڵمانت، ئەوەش هەرخێرە بە ڵکو خێری هەرگەورەیە.**

---

[1] رواه مسلم (٢٦٢٦)

٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ، ومن اقواله ﷺ : حديث: (( لا تكونوا إمعة " تقولون : إن أحسن الناس أحسنا ، وإن ظلموا ظلمنا ، ولكن وطنوا أنفسكم : إن أحسن الناس أن تحسنوا ، وإن أساءوا فلا تظلموا .))[1] .با هیچ كەسێك لە ئێوە خۆی نەتوێنێتەوە لە ناوكۆمەڵگەدا .

كەواتە: هەر كەسەو سەربەخۆیی ( ئیستیقلالیەتی ) خۆی هەبێت ، مادەم دەستی بە چاكەوە گرتووە ،باكاریگەری خراپی خەڵك كار لە ئەو نەكات .

لێرەدا فێری ئەوەمان دەكات كە كوێرانە بە شوێن دوای هیچ كەسێك نەكەوین! . بەڵكو خۆت رابهێنە لە سەر چاكە كردن و چاكە وتن با خۆت بەتەنهاش بیت.

ئادەمیزادەكان وەك جیهانی دارودرەختەكان وان ، شیرین و ترشیان هەیە، بڵند و نزمیان هەیە ، با مرۆڤەكانیش وابن ، ئەگەر تۆ وەك مۆز وایت، خۆت مەكە بە تور، چونكە جوانی و نرخت لەوە دایە وەك مۆزبیت ، چونكە بەڕاستی جیاوازی ڕەنگ و زمان و بەهرە و توانامان بەڵگە و نیشانەیەكە لە بەڵگەو نیشانە زۆرەكانی توانایی و بەهێزیی خوای گەورە، كەواتە دان بەوە دابنێ كە خودا خاوەن دەسەڵاتی.

٥) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : مەڵێ (( لو انی فعلت كذا لكان كذا و كذا و لكن قل : قدر الله وماشاء فعل ))[2] .

واتە : (مەڵێ: ئەگەر ئاوام بكردایە، ئاواهی دەبوو، بەڵكو بڵێ: ئەمە كاری خوایە و هەرچی ئەویش بییەوێ ببێ، دەبێ ببێت).

لێرەدا فێری ئەوەمان دەكات خۆراگرو ئارامگربین لە ئاست بە لاگەورەكاندا،لە دوای ئەوەی كە هەمووهۆكارێكت گرتبێتە بەر بۆسەركەوتن و ئەنجامدانی كارەكانت.

---

[1] الراوي :حذيفة بن اليمان – خلاصة الدرجة: إسناده ضعيف وقد صح موقوفا – المحدث: الألباني -المصدر: مشكاة المصابيح – الصفحة أو الرقم: ٥٠٥٧. ورقم الحديث – 106874 . بە كورتی(فەرموودەكە بە مەوقووفی لە سەرصەحابە راستە وتەواوە.

[2] صحيح مسلم رقم الحديث (٤٨١٦) دەقەكەی بەم شێوەیە (( عن ابي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ المؤمن القوي خير و احب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير، إحرص على ماينفعك واستعن بالله ولا تعجز، وان اصابك شيئاً فلا تقل لو أني فعلت كان كذا وكذا ولكن قل قدر الله، وماشاء فعل ، فأن لوتفتح عمل الشيطان. بروانە (سنن ان ماجة) وصححه الالباني، ومسند احمد والسنن الكبرى للبيهقي .

٦) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده و المؤمن من امنه الناس على دمائهم و اموالهم ))[١] .

واتە : (مرۆڤی موسڵمانی ڕاست ئەو کەسەیە کە سەرجەم موسڵمانان لە زمان و دەستی دڵنیا بن، باوەڕداری ڕاستیش ئەو کەسەیە ، کە خۆی بپارێزێ لەخوێن و شتی خەڵکی و ماڵی خەڵکی نەخوات) بە ستەم وفێڵ و تەڵەکە کردن ).

بەختەوەران خۆیان لە حەوانەوەیەکی بێ وێنەدان و خەڵکیش لێیان دڵنیایە، موسڵمانەکانیش لە ئاشتیدا دەژین لەگەڵیان.

لێرەدا بە راشکاوی پێمان دەفەرموێت خوا ئیسلامەتی لەکەسێك دەوێت و وەردەگرێت کە بێزەرەر و بێزیانبێت لەسەرخەڵك وبوونەوەر.!!

٧) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((ان الله امرني ان اصل من قطعني وان اعفو عمن ظلمني وأن اعطي من حرمني))[٢] .

واتە : (خودای گەورە فەرمانی پێکردووم هاتوچۆی کەسێك بکەم کە سەردانم ناکات ، ئەو کەسەی ستەمی لێ کردووم، لە کاتی دەسەڵاتمدا لێی ببورم ، هەر کەسێ یارمەتی لێ گرتوومەتەوە ، یارمەتی پێ ببەخشم لە کاتی هەبوونمدا). ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ سورة آل عمران/(١٣٤).

واتە : (ئەوکەسانەی ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوە و لێبووردەن بەرامبەر خراپەی خەڵکی چاکەکارن و خوداش چاکەکارانی خۆشدەوێ). ..مژدە بدە بەو کەسانەی کە ئەمە خوو و ڕەوشتییانە ، بە پاداشتێکی زۆر نزیك کە بریتییە لە دڵنیایی و ئاسایشی دەروون ، بەهەمان شێوە مژدەی پاداشتی گەورەی دوا ڕۆژیان بدەیە لە خزمەت خودایەکی لێخۆشبوو لە بەهەشتەکانی ئەودا ﴿فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ سورة القمر)).

واتە : (مژدەی لە جێ دانیشتنێکی بێ فڕوفێڵ لە خزمەت خودای بە دەسەڵات و بە توانا).

---

[١] صحيح البخاري.

[٢] پاش گەڕانێکی زۆر بەدوای فەرموودەکەدا تەنها، بەم شێوەیە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (یاعقبة صل من قطعك، واعط من حرمك، واعرض عن من ظلمك ) صحيح لغيره اخرجه الامام احمد برقم الحديث (١٧٣٧٢) وانظر الترغيب والترهيب للامام المنذري بتحقيق محمد ناصر الدين الالباني ورقم الحديث (٣٧١٩) هناك.

لە و فەرموودەدا گەورەیی پێغەمبەر ﷺ وسینەفراوانی لێبووردەیی بۆ دۆست ودووژمن دیاربوو.

٨) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( لا یفرك مؤمن مؤمنة وإن كره فیها خلق ارضى فیها اخر))[1].

واتە : ((هیچ ئیماندارێکی پیاو رقی لە خێزانە ئیماندارەکەی نەبێتەوە، چونکە ئەگەر خووڕەوشتێکی خێزانەکەی پێ باش نەبێ ئەوا ڕەوشتێکی تری هەیە تۆ پێی ڕازیت)).

کەواتە پێویستە لەسەرمان کارەکان قەبارەی خۆیان زیاتر نەدەینێ و شتەکان ئاسان و نزیك بکەینەوە ، ئەگەر رێگەی تێبچێت.

لێخۆشبوون و لێبووردەمان هەبێت ، خۆ لە شتێکی زۆر بچووك تێ نەگەیەنین، سەبوری خۆت بەوکەسانە بدە کە لەتۆ زیاتر تووشی ناخۆشی بوون .

ئەوەیە پێکەوە ژیان لە نێوان پیاو و ژندا بەلام ئەمڕۆ زۆرێك لە خانەوادەکان بەبچوکترین هۆکاردەستیان لەیەك دەترازێنن.!!

٩) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( ان الله اوحى الى ان تواضعوا ، حتى لا یبغي احد على احد ولا یفخر احد على احد ))[2]

واتە : (خودا نیگای بۆ هێناوم: فەرمانتان پێدەدات بەوەی بێفیز و خاکەڕا بن ، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك دەستدرێژی نەکاتە سەر کەسێکیتر ، هیچ کەسێك شانازی بە خۆیەوە نەکا و بەشان و باڵی خۆیدا هەڵنەڵێت لە سەر حسابی کەسێکیتر).

لە ئاینی ئیسلامە ، کە پێویستە بە خەندە (بزە) لەسەر لێوانمان بێ و ڕوومانگەش و کراوە بێت، سینگ و سینەمان فراوان بێت ، ڕەوشتمان نەرم و لەسەرخۆ بێت ، ڕۆحمان بەزەیی تیادا بێت ، ڕووی ئاسانکارییەکان بگرینە بەر!؟

بەڵێ پێغەمبەرﷺ ئەمەی لە و پەڕی تەواوی وجوانییدا بەجێهێناوە ، لە کاتی ئەو پەڕی دەسەڵات و حوکم رانی و دەست رۆیی هەبوونیدا هەربێفیز بووە!!

١٠) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (من كان له فضل زاد فلیعد به على من لازاد له ومن كان له فضل ظهر فلیعد به على من لا ظهر له )[3] .

واتە : (هەرکەسێ خواردنێکی زیادەی پێیە با بیبەخشێت بە کەسێ کە خواردنی پێ نییە، هەر کەسێکیش هۆی سواریی زیادەی پێیە با بیبەخشێ بەو کەسەی کە سواری پیادەیە).

---

[1] اخرجه مسلم برقم (١٤٦٩)

[2] صحیح ، صححه الالباني في سنن او داود برقم (٤٨٩٥) ، وابن ماجة برقم (٤١١٤).

[3] صحیح مسلم ژمارە (١٧٢٨)

لێرەدافێری ئەوەمان دەکات کە هاوکاری و یارمەتیدەری یەکتربین، هەرکەس تەنها خۆویست نەبێت بەس.

١١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:: (في كل كبد رطبة اجر[1] .

واته : (بۆ هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ، پاداشت هەیە).

فێری بەزەییمان دەکات تەنانەت لە گەڵ ئاژەڵو تێکڕای رۆح لە بەرانیشدا، خوای گەورەش پاداشتی لەسەر دەداتەوە.

١٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:: (( المؤمن يأْلَفُ ويُؤْلَفُ، ولا خير فيمن لا يألف ولا يؤلف ، وخير الناس أنفعهم للناس[2] ))

لێرەدا تێکڕای باوەڕدارەکان فێردەکات کە هەردەم کاریگەری چاك و باشیان هەبێت، لە نێوان تێکڕای مرۆڤایەتی ، بەڵام ئابێت لە سەر بەرژەوەندی مەبادی ئایینەکەیان بێت، بە تایبەت کۆمەکی لە نێوان باوەڕداران زیاتر فەرزترە ، دواتر پێمان دەفەرموێت چاکترین و باشترینتان ئەوەتانە کە بتوانێ زیاتر سوود وخێر بە بەتێکڕای خەڵکی بەگەیەنێ .

## بەشی دووەم:

## موحەممەد ﷺ بەکردارسەلمانوویەتی کە نموونەی تەواوی مرۆڤایەتیە :

لەوانە :

١) لێبوردەیی پێغەمبەر ﷺ بەرانبەر ئەکەسانەی کەهەوڵی کوشتنیان دابوو.

نزیکەی هەشتا کەس ڕێکەوتن بۆئەوەی بە شێوەیەك لە شێوەکان پێغەمبەر ئیغتیال) لەناوی بدەن، بەڵام هەوڵدانەکەیان سەری نەگرت و تێکڕایان دەستگیر ران! بەڵام پێغەمبەر ئازادی کردن!!

ئایا چ سەرۆکێك بووە و هەیە لە تێکڕای دوونیا نزیکەی هەشتا کەس کۆبینەوەو یەك بگرن بۆ ئەوەی لە ناوی ببەن، سەرەرای ئەوەش سەربەت وئازادی کردن.[3]

---

[1] بەزۆر شێوە هاتووە لەوانە صحيحى البخارى (٢٣٦٣) ومسلم (٢٢٤٤) وصحيح ابن ماجه (٥٤٤ — ٥٨٨٢) وابو داود (٢٥٥٠) ومالك (٩٢٩/٢) واحمد ٢٢٢/٢)

[2] حسن صحيح انظر (( سلسلة الأحاديث الصحيحة) (( ج١/ص٧٨٧... ).

[3] رواه مسلم والترمذي وابوداود وغيرة.

وەك ئاماژەی ئەم ئایەتە أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الفتح: ٢٤

٢) كابرایەك هوڵی تووڕەكردنی پێغەمبەری دا، بەلاّم پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئارمگر بوو، هەتا هاوەڵانی ئەمەیان زۆر لەسەر دڵگران بوو،خەریك ئازاری كابرا بەدن بەلاّم پێغە مبەر(ﷺ) فەرمانی ئەوەی بەسەردا كردن كە بە چاكتر ولێبوردەیی وەلاّمی بدە نەوە !!!بۆیە لە دواتر عومەری كوڕی خەتتاب لە كابرای پرسی تۆ بۆچی ئەم سەڵسو وكەوتنە سەیرە نامۆیە كرد بەرانبرە پێغەمبەر ؟ ئەویش لە وەلاّمدا، وتی:(من هەموو شتێكم تاقیكربووە لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ، تەنها ئەوەمابوو لە سیفەتی پێغە مبەرایتی بزانم ئایا تاچ رادەیەك لێبوردەی هەیە، بۆیە تۆ شایەد بە من باوەڕم بە پێغەمبەر هێناوە، لە جەنگێك شەهیدبوو .[1]

٣) خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ ئومەتەكەی :

ئەم خۆشەویستیەی پێغەمبەر ﷺبۆ ئومەتەكەی بۆ هەموو سەردەمەكانی دوای خۆ شیەتی تا دوارۆژ(امتي ،امتي، امتي، خوای گەورفەرمووی لانسؤك في امتك،)[2]

واتە: خوایە تۆ لە ئۆمەتی من رازی بە لە وەلاّمدا خواش فەرمووی‌محمد تۆ رازی دەكەیت لە ئەمەكەت، واتە داوای تۆ بۆ ئوممەتەكەت پەسەندە لە لای خوا.

ئەوەیە دڵسۆزی وەفایی و خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئوممەتەكەی، بەلاّم هە ندێك لە بەرپرسانی ئیستا هەر ئەوەندە ئیشیان بەخەڵكی هەیە هەتا هەڵیان دەبژێرن زۆر زوو وخێرا لە بیریان دەچن!!!؟

٤) عەلی كوری باوكی تالیب دەڵێت : لەهەموو كەس سەخیتر بوو، لە هەموكەس راتسگۆتربووە، لەهەلسووكەوتی لەهەمووكەس خۆشتر لەبارو شیاوتر بووە، هەر كەسێ چاوی بەدیداری بكەتایە خۆشی دەویستی دەوكتە دڵیەوە، بە كورتی وەسفی پێغەمبەر ﷺ (لە تەواوی وجوانی رەوشت بەرزی نەبووە لە وەوبەر و نابێت لەمەودوا)،[3]

٥) ما إنتقم لنفسه ﷺ[4]

( هەرگیز تۆڵەی لە دوژمن نەسەندووە).

---

[1] رواه الطبراني في الكبير وابن حبان والحاكم والبيهقي وابو نعيم في الدلائل.

[2] بخاری ومسلم حدیث قدسي

[3] أخرجه الترمذي وابن سعد في شرح السنة والبيهقي في شعب الايمان.

[4] رواه الترمذي في الشمائل

ئەمەش لێبوودیی بێوێنەی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات بۆ دۆست دوژمن.

٦) (ما ضرب رسول الله )[1]

هەرگیز بەدەستی خۆی لە ئافرەت خزمەتکارو منداڵی نەداوە!!؟

بەڵام ئەمڕۆ هەرکەس دەسەڵاتی هەبوو لاوازو بێدەسەڵاتەکان دەچەوسێنێتەوە.

٧) (لا نقول إلا مايرضى ربنا، )[2]

لە کاتی کۆچ خۆشوسترین کەسی هیچ شتێکی نەوتوە کە خوا رازی نەبێ.

٨) عفوه لمن أراد قتله، کابرا شیری لە سەرگەردنی دانا بۆ کوشتنی بەڵام کاتێك خوا پێغە مبەری پاراستئازادی کردهەرئەوش بووە هۆی موسوڵمانبوونی تێکڕای عەشیرەتەکەی!.

بەڵام ئەمڕۆ هەزاران بێتاوان دەگیرێن بە بیانووی ئەوەی کە گوایە نیازی شتێکیان هەبوو بێ ، وەك ئەوەی دڵیان کۆلیبن!!!.

٩) خودا دەفەرموێت : ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾ال عمران/١٥٢

واتە : (لە (بەزەیی)ی خودایە کە تۆ نەرمونیانی بۆیان، ئەگەر توند و دڵڕەق بوویتایە، ئەوان پەرشوبڵاو دەبوون بە چوار دەورتا، کەسیان لە دەورت نەدەمان).. . بەڵام ئەمڕۆ نەرمی ولێبوردەیی وسۆزە نابینین!!

## بەشی سێیەم:

## ڕەوشت بەرزی وجوانی و تەواوی پێغەمبەر ﷺ.

١) دایکی باوەڕداران: عائشە کچی ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خودایان لێ بێ، لە باسی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ پارێزرا و لە هەموو نەنگی یەك (کان خلقه القرآن)[3]

واتە : (ڕەوشتی جوان و بەرزی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە قورئان) .

٢) یان دەڵێت (کان قرآناً یمشی في الأرض )[4] .

واتە : (قورئانێك بوو لەسەر زەویدا دەڕۆیشت) .

بەواتای ئەوەی وەك قورئانی بەسەر خۆیدا بەجێ دەهێنا.

---

[1] رواه الترمذي في الشمائل واحمد في المسند عن انس.

[2] متفق عليه

[3] شمائل المحمدية للترمذي ومحمد جميل زينو، والحديث حسن رواه امام احمد.

٤ شمائل المحمدية للترمذي ومحمد جميل زينو، والحديث حسن رواه امام احمد.

٣)وەك هەندێك لە هاوەڵان دەڵێن : كان احسن الناس خلقاً[1]

واتە لەهەمووكەس ڕەوشت بەرزو جوا نتربوو.

٤)چونكە پێغەمبەر ﷺ خۆی دەفەرموێت : ( ان المرء ليبلغ بحسن خلقه درجة الصائم القائم)[2]

واتە : مرۆڤ بە جوانیی ڕەوشتی، پلەوپایەی ڕۆژووگر و شەونوێژكار بە دەست دێنێت.

٥) هەر لەبەر ئەوەشە پێغەمبەر ﷺ ڕەوشت بەرزانی خۆشدەویٚ بۆیە دەفەرموێت : ( لا انبئكم باحبكم واقربكم مني مجلساً يوم القيامة؟! إحسانكم اخلاقاً )[3].

واتە : (ئایا پێتان بڵێم بە خۆشەویسترین و نزیكترین كەس لە ئێوە بۆ من لەڕۆژی دوایيدا؟! ڕەوشتبەرز و جوانتر).

٦) خودا دەفەرموێت وسوێند دەخوات كە پێغەمبەر ﷺ، لە سەر ڕەوشتی بەرزە ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ القلم: ٤

واتە : (واتە بەڕاستی تۆ (ئەی پێغەمبەر) ﷺ لەسەر ئەوپەڕی ڕەوشتی بەرز و گەورەی) .

چونكە فەرمانی خوا بەجێدێنیٚ كە دەفەرموێت : ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴾ البقرة: ٨٣ .

واتە : ( ئێوە با قسەتان جوان و خۆش بێت لەگەڵ خەڵكی).

## بەشی چوارەم:

### وەسێتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو كەسانەی تووش بوون بە بەڵا وم موسیبەت، چونكە مرۆڤ كەهاتە دوونیاوە خۆشی و ناخۆشی دەبینی بۆیە پێویستە ئەم ئامۆژگاریانە وەرگرێت لە پێغەمبەر ﷺ .

لەوانە:

١) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ( ان الله اذا احب قوماً ابتلاهم فمن رضى فله الرضا ومن سخط فله السخط)[4] .

واتە : (خودا ئەگەر كەسانێكی خۆش بویٚ تاقییان دەكاتەوە، هەر كەس ڕازی بێ بە ویستی خودا، خوداش لە ئەو ڕازی دەبیٚ، هەركەسیٚ بەشی خودای پیٚ باش نەبیٚ، خوداش لەو ڕازی نابیٚ).

[1] لە زۆرێك لە هاوەڵانیەوە ئەم وتەیە دووبارە بووەتەوە دەربارەی پێغەمبەر ،شمائل الترمذي

[2] رواه ابو داود (٤٧٨٩) صحيح بروانە مشكاه (٥٠١٢) .

[3] رواه الترمذي (٢٠١٨) الصحيحة (٧٩١)

[4] رواه الترمذي (٢٣٩٦) حسن الصحيحه (١٢٢٠) والمشكاة (١٥٦٥) ونص الحديث في ابن ماجة (٤٠٣١)

٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( اشد الناس بلاء الانبیاء، ثم الامثل فالامثل ، یبتلی الرجل علی قدره دینه فان کان في دینه صلابة اشتد بلاؤه، وان کان في دینه رقة ابتلی علی قدره دینه فما یبرح البلاء بالعبد حتی یترکه یمشي علی الارض وما علیه من خطیئة)[1].

واته : (له هەموو کەس زیاتر كه تووشی بەلاّ دەبن، پێغەمبەرانن (درودی خوایان لەسەر بێت) ، لەپاش هەر کەس وەك ئەوان، ئینجا هەر کەس وەك ئەوان بن ، مرۆڤ هەریەك بەپێی باوەڕەکەی تاقی دەکرێتەوە . ئەگەر لە ناو ئایینەکەی توندوتۆڵ بێت ئەوا تاقیکردنەوە توند و گەورە دەبێ .بەڵام ئەگەر باوەڕت زۆر بەهێز نەبێ نەرم و لاواز بێت، بەپێی ئەم نەرم و لاوازییەی خۆی، تاقی دەکرێتەوە، بەلاّ دەرفەت بە مرۆڤ نادا و كۆڵی لێ نادا، هەتا کاتێ بەجێی دەهێڵێ، ئەو مرۆڤە بەسەر زەویدا دەڕوات هیچ گوناهی نەماوەو خاوێن و باوێن دەبێتەوە لەگوناهەکان).

٣) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (عجباً لامر المؤمن ان امره کله خیر !! لیس ذلك لاحد الا المؤمن ان اصابته سراء شکر فکان خیراً له وان صابته ضراء صبر فکان خیراً له )[2] .

واته : کاری خاوەن ئیمان جێی سەرسوڕمانە، هەموو کارەکانی بۆی خێرن!! ئەمەش بۆ کەسی تر نیە، تەنها بۆ باوەڕدار نەبێ، کاتێ ئەگەر تووشی خۆشی و دەوڵەمەندی لەشساغ بێت، سوپاس وپێزانینی خودا دەکات، ئەمەش خێرە بۆی، کاتێ ئەگەر تووشی ناخۆشی و بێزاری و هەژاری بێ دان بەخۆدا دەگرێت، ئەمەش خێرە بۆ ئەو.

١٠) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:: (یبتلی الصالحون، فالأمثل فالامثل)[3].

واته : پیاوچاکان تاقی دەکرێنەوە، کێش چاك بێت وەك ئەوان تاقی دەکرێتەوە.

١١)پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( المؤمن کالخامة من الزرع تفیئها الریح یمنه ویسره))[4]

واته : مرۆڤی باوەڕدار وەك رووەکێکی چێنراو وایە (با) بۆ لای ڕاست و بۆ لای چەپی دەبا و دەیهێنێ.

ئەمەش هەموو لەبەر ئەوەیە موسوڵمان خاوێن ببێتەوە ئامادەبێت بۆ بەهەشت.

---

[1] رواه الترمذي (٢٣٩٦) الصحیحه (١٢٢٠) والمشکاة ( ١٥٦٥) وابن ماجة (٤٠٣١) صحیح حسن.

[2] متفق علیه بڕوانه (ریاض الصالحین) ،باب الصبر

[3] فەرموودەیە ترمذي وابن ماجه ڕیوایەتیان کردووە حسن صحیحه وەك البانی (١١٢٢٠) لە صحیح دایه.

[4] پێشتر باس کراوه.

## بەشی پێنجەم :

## التنمیه البشریه، پەرەپێدان وگەشە پێكردنی مرۆڤ:

بێگومان ئەمڕۆ چەندەها زانكۆ و دیراسات تەرخان كراوە بۆ ئەمە مەبەستە، بۆیە وەك نموونە هەندێك خاڵ وئاماژەی پێغەمبەر ﷺ باس دەكەین وەك دڵۆپێك لە دەریای بێ پەی موحەممەدا ﷺ📖

لەوانە:

١) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( و احبب حبیبك هوناً ما ، فعسی ان یكون بغیضك یوماً ما، وابغیض بغیضك هوناً ما ، فعسی ان یكون حبیبك یوماً ما ))[1].

واتە : (خۆشت بوێ خۆشەویستەكەت بە شێوەیەك زۆر ڕۆمەچۆ لە خۆشەویستیدا، دەرفەتی تیادا بهێلە لەوانەیە رۆژێك دابێت ببێت بە یەكێك لە دوژمنەكانت، رقبوونت دژ دووژمنەكەت بە شێوەیەك بێت زۆر رۆمەچۆ لەن دوژمنەكەت لە رقبوندا ، دەرفەتی تیادا بهێلە لەوانەیە رۆژێك دابێت ببێت بە یەكێك لە خۆشەویستەكانت).

گەورە ترین هونەری تەكنیكو هەڵسووكەوتە بۆ مرۆڤ كە تووشی رۆچوون داچوون نەبێت كە سەردەكێشن بۆ هەموو كارو وتەیەكی نەخوازراو.

٢) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((واسألك العدل في الغضب والرضا))[2].

واتە : (ئەی خوایە! داوات لێ دەكەم یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی دادپەروەریم لە كاتی تووڕەیی و رازیبوونم).

هەركەسێ بتوانێ ركێفی سۆزی خۆی بكاو هۆش بكات بەخاوەن دەسەڵات، شتەكان ببێوێ بە پێوەری خۆی، بۆ هەرشتە و كێش و بەهای خۆی بداتێ، ئەو كات ڕاستییەكان بە ڕوونی دەبینێ، ڕێگەی ڕاست و ڕەوان دەناسێ، بە سەر راستییەكان دەكەوێت.

هەرناداد پەروەریە كە تێكراپ گەندەڵی بێ وەفایی بێنەمەكی لێدەكەوێتەوە.

٣) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( اذا اصبحت فلا تنتظر المساء ، واذا امسیت فلا تنتظر الصباح ))[3]

---

[1] بروانە (الاوسط) للطبراني و حسنه الالباني وغیره الترمذي (١٩٩٧)

[2] رواه النسائي ، بەرقم (١٣٠٦) بەم شێوەو (كلمة الاخلاص في الرضا و الغضب) ، احمد والنسائی بەم شێوە(كلمة الحق)

[3] لەمە پاش دێت توێژینەوەی زانایانی فەرموودە لە بارەیەوە بەدرێژی انشاء الله ، تورموزی گێراویەتەوە

هیوای کورتت هەبێت، چاوەڕوانی کۆتایی تەمەنت بکە بۆ ئەوەی کرداری جوان وباش ئەنجام بدەی. بە هیوا وحەزەکانت بپەڕیتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە تیایدا دەژی، ئەوکات چڕی بیرکر نەوەت ڕووی تێ بکا، کاروبارەکانت ڕێکوپێك بکە بە لێشاو گرنگی بدە بەو کارانە، ڕەوشتی خۆت جوان بکە، گرنگی تەواو بدە بەتەندروستی خۆت چاکسازی خووڕەوشتی خۆت بکە لەگەڵ خەڵکانی تر.

فێری ئەوەت دەکات هەردەم لەچاکسازیدابیت لە ڕۆح لاشەو ویژدان و دڵ و دەروونی خۆتدا.

٤) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (عجباً لأمر المؤمن ان امره كان كله له خير، ان اصابته سراء شكر فكان خيراً له ، وان اصابته ضراء صبر فكان خيراً له وليس ذلك الا للمؤمن )[1].

واتە : کاری باوەڕدار جێی سەرسوڕمانە، چونکە بەڕاستی هەموو کارەکانی هەر بۆی خێرن، ئەمەش بۆ کەسی تر نییە بێجگە لە باوەڕدار، ئەگەر خۆشییەکی دەست گیر ببێ سوپاسی خودای لەسەر دەکات و بۆی دەبێت بە خێر ئەگەر تووشی نارەحەتی و ناخۆشی بوو دان بە خۆیدا دەگرێت، هەر بە خێر بۆی دەنوسرێ.

فێری دڵنیایی ئارامگری وئاسوودەییت دەکات.

٥) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اذا سالت فاسال الله، واذا استعنت فاستعن بالله، واعلم ان الامة لو اجتمعت على ان ينفعوك بشيء لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله لك ، وان اجتمعوا على ان يضروك بشيء لم يضروك بشيء الا بشيء قد كتبه الله عليك ورفعت الاقلام و جفت الصحف))[2] .

واتە : (ئەگەر داوات کرد تەنها داوا لە خودا بکە، ئەگەر داوای پشتبەستنت کرد تەنها پشت بە خودا ببەستە، بزانە ئەگەر هەموو خەڵك کۆببێتەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن سوودت پێ بگەیەنن ئەگەر بە شتێك نەبێت کە خودا بۆی نووسیبووی، ئەگەر کۆببنەوە بۆ ئەوەی تووشی ناخۆشیت بکەن، ناتوانن تووشت بکەن ئەگەر بە شتێك نەبێت کە خودا لەسەری نووسیبووی، پێنوسەکان هەڵگیراون تێنووسراوەکانیش وشك بوونەوە).

فێری هەوڵ وتێکۆشان و بێفیزی بایی نەببونت دەکات ، هیوای بەخوا هەبێت ، ئاستەنگەکان نەبنە پاشەکشێکردنت بۆ بەرەو پێشچوون و پی شبردنی خۆت.

---

[1] صحيح مسلم (٢٩٩٩)

[2] رواه الترمذي وحسنه الامام النووي في ملحق كتاب الازكار و حسنه الالباني في تصحيحه للترمذي ، لەمەوپاش درێژتر لەسەری دەدوێین ، انشاء الله.

٦) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( واعلم ان النصر مع الصبر وان الفرج مع الكرب وان مع العسر يسرى))[1] .

واتە : (بزانە سەرکەوتن لەگەڵ دانبەخۆداگرتن دێت، دەرفەت لەگەڵ ناخۆشییەکان دێت، لەگەڵ نارەحەتی ئاسانکاری دێت) .

سەرکەتن هۆی ئارامگری ساتێکە، دان بەخۆدا دڵنیایە لە هەنگاوەکانی.

٧) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( المؤمن كالخامة تفيئها الريح يمنه ويسرة ))[2]

واتە : (مرۆڤی موسڵمان وەك دارێکی نرم وایە لە ڕووەکەکان (با) وەهوا بەملاو ئەولادا دەبات - واتە - بە لای ڕاست و بە لای چەپدا).

مرۆڤی کارزانیش ئەو کەسەیە وەك ئاو وابێ خۆی بە بەرددا نادات، بەڵکو بە لای ڕاست و بە لای چەپیدا دەڕوات و لە سەرەوە و لە ژێرەوە دێت .

لێرەدا ، فێری مروونەو( واقیع بینیت دەکات).

٨) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:: (( ما انزل الله من داء الا وانزل له دواء علمه من علمه وجهله من جهله ))[3] .

واتە : (خودا هیچ بەڵایەکی نەناردووە تەنها ئەوە نەبێ کە چارەسەری بۆ هێناوەتە خوارێ و هەرکەسێ بیزانێ زانیویەتی، هەرکەسێ نەیزانێ نەیزانیوە) .

هیچ کێشەو گرفتێك بێچارە سەرنیە بۆیە مرۆڤی موسوڵمان داهێنەرە هەردەم دەگەڕێت بە دوای ڕاستی هەقدا.

٩) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: : ( لاتغضب ، لاتغضب ، لاتغضب) [4]

واتە : تورە مەبە ، تورەمەبە ، تورەمەبە .

تێکرای کێشەو گرفتەکان لە توورەیی بێئارامیەوە سەردەکێشن بەجۆرێك لە جۆرەکان

١٠) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:: ( الغضب جمرة من النار )[5]

واتە: (توورەیی پشکۆیەکە لە ئاگر).

---

[1] ترمذی (دەرمان هێناوە) پێشتر.

[2] صحيح البخاري ٢١٣٧/٥ ذمارة ٥٣١٩، واحمد (٢٨٢١٥) وغيرهم.

[3] صحيح : بڕوانە ابن ماجة (٣٤٣٨ – ٣٤٣٩) واحمد وحاكم وغيرهم .

[4] رواه البخاري (٤٣١/١٠)

[5] رواه ابو داود (٤١٢٥) احمد (٢٢٦/٤) بەم شیوقیة (ان الغضب من الشيطان، وان الشيطان حلق من النار وانهما تطفأ النار بالماء) بروانة مختصر منهاج القاصرين.

بێ گومان شەیتان بەسێ شت زاڵ دەبێت بەسەر مرۆڤدا :
(تورەیی ، ئارەزووبازی ، بێئاگایی).

٩) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((الید العلیا خیر من الید السفلی ))[١] .

واته : (دەستی بڵند و بەرز باشتر و خێرترە لە دەستی نەوی و نزم) .

دەستی بڵند : دەستی بەخشینە .دەستی نەوی: دەستی وەرگرە.

هەردەم بە سوود بەخشەربە بە وڵات نیشتمان و گەلت.

١٠) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: : (نعم المال الصالح للرجل الصالح )[٢] .

واته : باشترین ماڵی باش بۆ پیاوی باشە، بەواتا بۆ کەسی باشە.

ئەوەی کە دەبێتە هۆی بەدبەختی و هیوابڕان درووست زیاد بوونی خەمەکان و پەژارەکانی قەرزارییە.

بەڵێ بە ڕاستی ئاینی ئیسلام هانی شوێنکەوتوانی دەدات بۆ وەدەستهێنانی ماڵ و سامان بە ڕێگەی شیاو و درووستی خۆی، بە هەمان شێوە بەکارهێنانیشی لە جێگای شیاوی خۆی، بە هۆی سامانەکانیانەوە و چاوەڕوانیی دەستی خەڵك نەبن .

## بەشی شەشەم:

## گەورەیی پیرۆزی پێغەمبەری خوا

١) ئەو فەرموودەیەی کە خودا دەفەرموێت ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوا أَنفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ النساء/٦

واته : (ئەگەر هاتوو ئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد بە ئەنجامدانی تاوانێك بێنەلای تۆ و داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن و پێغەمبەریش ﷺ بۆیان بپاڕێتەوە، ئەوکات میهرەبانی خودا و سۆزیان بۆ بەدەست دێت).

کەواته پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە سڕینەوەی تاوانەکان.

٢) خوای گەورە سزانانێرت مادەم پێغەمبەر پێغەمبەر ﷺ مابێت .

---

[١] البخاري (٥٣٥٥ ، ١٤٢٧) وابن حبان (٣٣٦١ — ٤٢٤٥) واحمد ٤٧٦/٢ وابو داود (١٦٤٨)

[٢] رواه ابن ماجة وغیره فیه خالد بن عمر القرشي قال الحافظ رماه یحی بن معین بالکذب وصححه الالباني في الصحیحه (٩٤٤) لشواهده وبشواهده .

قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنفال: ٣٣...

بوونی پێغەمبەر ﷺ خەڵك دەپارێزێ لە غەزەب وخەشمی خوا كەنەتەوەكانیتری گرتووەتەوە.

٣) پێغەمبەر دڵسۆزە بە ئوممەتەكەی:

قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: ١٢٨ .

دڵی لە سەرتانەو دڵتەنگ دەبێ كاتێك شتێكی نەخوازراو بكەن ، خۆشی بەختەوەری ئێوەی دەوێت.

٤) پێغەمبەر لە پیشترە لە هەموو كەسێكمان : قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ الأحزاب: ٦

كەواتە مافی پێغەمبەر وبەرەڤانی كردن لێی، لە پێشترە لە دەرووونی خۆت ومندالٌ خێزان خزم وكەسەكانتەوە.

٥) هاوسەرانی پێغەمبەر دایكانی راستەقینەی موسوڵمانن قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ ﴾ الأحزاب: ٦

كەواتە خێزانەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەم دەقەی قورئان دایكی تێكڕای باوەڕدارانن وبەرەڤانی كردن لێیان، لە پێشترە لە بەرەڤانیكردن لە دایكی خۆمان.



## بەشی حەوتەم:

### كێن كە وا شاهێدن بۆ پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ

١) خــوای بــە گــەورەیی خــۆی :قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ ﴾ المنافقون: ١

واتە: خوا شاهێدی دەدات دەزانێ كە تۆ ئەی موحەممەد پێغەمبەری ﷺ ری خوای.

٢) شــهادە الملائكــە قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾ النساء: ١٦٦

فریشتەكانیش شاهێدی ئەوە دەدەن كە تۆ ئەی موحەممەد خوا قورئانی بۆ تۆ ناردووە.

٣) القــرآن قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ ﴾ المائدة: ٤١

واتە ئەی پێغەمبەر ﷺ ری خوای دڵت تەنگ نەبێ لەسەرخراپەی بێباوەڕەكان.

٤) الكتــب الســابقة قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ البقرة: ١٤٦ قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الأنعام: ٢٠

واتە : ئەوانەی كە خاوەنی پەرتووكی ئاسمانین دەزانن تۆ پێغەمبەری ﷺ ری خوای.

وەك چۆن منداڵەكانی خۆیان دەناسنەوە.

٥) الانبیاء السابقة مبشرا برسولا یأتي من بعدی: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ ﴾ الصف: ٦ .

واتە: (عیسا دەفەرموێت من مژدەی پێغەمبەرێكتان پێدەدەم).

٦) الیهود والنصاری یعرفونه كما یعرفون ابنائهم قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ البقرة: ١٤٦

قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ الَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ الْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ الَّذِينَ خَسِرُوٓا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الأنعام: ٢٠

واتە: جوولەکەو گاوورەکان دەزانن تۆ پێغەمبەری خوایت وەك چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسنەوە.

٧) تەنانەت مونافیقە کانیش : قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ إِذَا جَآءَكَ الْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ﴾ المنافقون:

واتە: تەنانەت دووروەکانیش شاهێدی ئەوە دەدەن کە تۆ پێغەمبەری ﷺ ری خوای.

٨) پێغەمبەر ﷺ ری خوای دەفەرموێت .الحجر انی لأعرف حجرا بمکة کان یسلم علی لأعرفه الآن،

واتە: ( بەردێك سەلامی لێدەکردم ئیستاش دەیناسمەوە).

٩) پێغەمبەر ﷺ ری خوای دەفەرموێت .والاحجار التی کانت تسبح .

ئەو بەردانەی کە تسبیحاتیان دەکرد لە ناودەستی پێغەمبەرو ابوبکر عومریش!

١٠) کێوی ئوحود هەژا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی خۆراگربە ئەی کێوی ئوحود پێغەمبەر ﷺ راستگۆی دووشەهیددت لەسەرە، کێوەکە دامرکایەوە.

١١) خواردنێك پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ کرا ، ژەهراوی کرا بەڵام ژەهرەکە وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ من ژەهراوی کراوم بۆ شەهیدکردنی تۆ.

١٢) الشجر انین الشجرللرسول،جذع النخل، دارە وشکەکەی دارخورماکە گریا بۆ پێغەمبەر بەبرچاو تێکرای هاوەڵان بۆیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە ئامێزی خۆی گرت هێواش هێواش بێدەنگ بوو.

١٣) خلودسالتە، ئاینەکەی پارێزراوە قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩

١٤) قورئان بۆ هەتاهەتایە بە ڵگەیە لەناوخەڵك ،معجزته الشاهدة الناطقة قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَادْعُوا شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٣ ـ ٢٤

# بەشی هەشتەم :

## الصلاة عليه، سوودوبەرەکەتی سڵاوات دان لە سەر پێغەمبەر ﷺ

**زۆرن لەوانە :**

١. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (اذن يكفى همك و يغفر لك ذنبك) .

واتە :(کەواتە خەمت دەڕوات و لای دەدات ولە تاوانەکانت خۆش دەبێ ) لە وەڵامی (ئوبەی کوڕی کەعبدا) ئەمەی فەرموو کاتێ وتی (من هەموو نوێژەکەم کەبە شەو نوێژکردنم تەرخان دەکەم بۆ سڵاوات لە سەرتۆ؟) وەك پرسیارێك ئەمەی لە خزمەت پێغەمبەردا وت ﷺ.[1]

٢. -دەسکەوتنی دەسەڵاوات بۆ هەر کەسێك کە سەڵاوات بدات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خودای گەورەوە بۆ هەر کەسێك کە سەڵاوات دەنێرێ.

٣-(دە) پلەو پایەت بۆ دەنووسرێت و بەرزدەبێتەوە .

٤-(دە) خێرو چاکەت بۆ دەنووسرێت.

٥-(دە) خراپەو تاوانت لێ دەسرێتەوە.

٦_هۆیە: بۆ سڕینەوەی تاوانەکان.

٧_هۆیە :بۆ پشت گرتنی خودایی بۆ مرۆڤ.

٨_هۆیە :بۆ نزیکبوونەوەلە پێغەمبەرەوە ﷺ

٩_جێگەی خێرکردن بە پارەو پول دەگرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی نەدارو هەژارن.

١٠-هۆیە : بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانت.



[1] رواه الترمذي وحسنه الالباني.

## بەشى نۆيەم:

## : چێژ وەرگرتنى پێغەمبەر ﷺ لە موناجات و پەيوەندى راستەوخۆو پارانەوەى بۆ لاى خوا :

١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( لا اله الا الله العظيم الحليم ، لا اله الا الله رب العرش العظيم ، لا اله الا الله رب السموات و رب الارض و رب العرش الكريم ، يا حي يا قيوم لا اله الا انت برحمتك اسغيث ))[1]

واتە : ( هيچ خودايەك نييە تەنها الله نەبێت خاوەنى عەرشى گەورە ، هيچ خودايەك نييە تەنها الله نەبێت گەورەيى هەر بۆ ئەوە، ئەو پەڕى بەزەيى هەر لە خوداوەيە ، هيچ خودايەك نييە تەنها الله نەبێت ، خاوەنى ئاسمانەكان و زەوى و خاوەنى عەرشى ميهرەبانە ، ئەى خوداى هەردەم زيندووى هەموو شتت بە تۆ گيراوە و تۆ راتگروون، هيچ خوايەك نييە جگە لە تۆ بە ميهرەبانى خۆت پەنادەگرم) .

٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((اللهم رحمتك ارجوا ، فلا تكلنى إلى نفسي طرفة عين واصلح لي شاني كله لا اله الا انت))[2] .

واتە: (پەروەردگارى هەموو جيهان هيواى ڕەحم و ميهرەبانى تۆم هەيە ، نەم دەيە دەستى خۆم ئەگەر بۆ چاوتروكانێكيش بێت ، هەموو كارەكانم بۆ ئاسان كەى هيچ خوايەك نييە بێجگە لە تۆ).

٣) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( استغفرالله الذي لا اله الا هو الحي القيوم واتوب اليه ))[3] .

---

[1] خرجه البخاري برقم (٦٣٤٥) ومسلم برقم (٢٧٣٠) .

[2] لەڕاستيدا بەم شێوەيە دە ستم نەكەوت بەڵام پارانەوەيەكى تر هەيە كۆكراوەى خێرى دونياو قيامەتە وەك لەفەرمووودەى ژمارە (٢٦٩٧) دا هاتووە لەتاريقى كوڕى ئەشيەمى ئەسجەعى، كە گوێى لێ بوو پێغەمبەر ﷺ بەكابرايەكى فەرموو كە پرسيارى ئەوەى كردبوو كە چى بڵێ كاتێ دەپاڕێتەوە لەخودا فەرمووى بڵێ (( قل اللهم اغفر لي وارحمني وعافني وارزقني فان هولاء يجمع لك دنياك و اخرتك))

[3] عن ابن مسعود رض الله عنه قال رسول الله ﷺ (( من قال استغفر الله الذي لا اله الا هو الحي القيوم واتوب اليه غفرت ذنوبه، وان كان قد فر من الزحف)) رقم الحديث في الاذكار للنووي (١٢٣٦) والحديث هذا قد اخرجه البخاري في التاريخ الكبير (٣/٣٧٩ – ٣٨٠) وابو داود (١٥١٧) ، والترمذي برقم (٣٦٤٨) قال الترمذي غريب لا نعرفه الا من هذا الوجه هذا..

واته : (دەگەڕێمەوه بۆ لای ئەو ئەڵڵایەی كه هیچ خودایەك نییه بێجگه لەئەو، هەمیشه زیندوو بێ و هەمیشه هەموو شتت به ئەو گیراوه و ئەو رایگرتوون ، داوای لێخۆشبوون هەر له ئەو دەكەم).

٤) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لا اله الا الله انت سبحانك إني كنت من الظالمين ))[1]

واته : (هیچ خودایەك نییه جگه له تۆ پاك و بێگەردی هەر بۆ تۆیه ، من یەكێك بووم لەو كەسانەی كه ستەمكاربوون).

٥) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( اللهم اني عبدك ابن عبدك ابن امتك ناصيتي بيدك ماض في حكمك ، عدل في قضاؤك ، اسالك بكل اسم هو لك سميت به نفسك او انزلته في كتابك او علمته احدا من خلقك ، او إستأثرتهُ به في علم الغيب عندك ان تجعل القران العظيم ربيع قلبي ، ونور صدري ، وذهاب همي وجلاء حزني ))[2] .

واته : (ئەی پەروەردگارمان ، بەنده و كوڕه بەندەی تۆم ، دایكم بەندەی تۆیه ناوچاوانم بەدەست تۆیه ، فەرمانەكانت له مندا بەجێ بوون ، تۆ ئەی خودایه دادەروەری له دادگایی كردنم ، لێت دەپاڕێمەوه به هەموو ناوەكانی خۆت كه بۆخۆت ناوی خۆتت لێناوه ، یان له قورئانا ناردوته خوارێ ، یان هەر دروست كراوێكی خۆت پێناساندبێ ، یان تەنها لای

---

وللحديث شاهد آخر عن ابن مسعود رضي الله اخرجه الحاكم (٥١١/١) وقال صحيح على شرط الشخين"

وتعقيه الذهبي قائلاً : ابو سنان هو "ضرار بن حرة" لم يخرج له البخاري في صحيحه قال صاحب كتاب نيل الأوطار بتخريج احاديث الاذكار س (٨٥٦/٢) اسناده صحيح وصاحب كتاب نيل الاوطارالذي هو سليم بن عبدالهلالي الاثري السلفي والذي حقق كتاب الاذكار تحقيقاً كاملاً وشاملاً فجزاه الله خيراً .

[1] عن سعيد بن الخدري رض الله عنه قال قال رسول الله ﷺ (( دعوه ذي النون اذ دعا ربه وهو في بطن الحوت (( لا اله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين )) صحيح اخرجه الترمذي رقم (٣٥٧٢) واحمد (١٧٠/١) والحاكم (٥٠٥/١) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي رقم الحديث في الاذكار للامام النووي ٣٥٥ وصححه الالباني في سنن الترمذي ، والذي برقم (٣٥٧٢).

[2] عن ابي موسى الاشعري رضي الله عنه قال قال رسول الله ﷺ (( من اصابه هم او حزن فليدع بهذه الكلمات يقول انا عبد ابن عبدك وابن امتك .......)) هه تا كۆتايي فه رمووده كه .رقم الحديث في كتاب الاذكار للامام النووي رحمه الله (٣٥٨) والحديث صحيح بشواهده، اخرجه ابن السني (٣٤١) بأسناد ضعيف، وللحديث شاهد، اخرجه امام احمد (٣٩١/١ و ٤٥٢) وابن حبان (٢٣٧٢) والحاكم (٥٠٠٩/١) وابن ابي شبيه (٢٥٣/١٠) الطبراني في التاريخ الكبير ١٠٣٥٢ وابو يعلي (١٩٨/٩ . ١٩٩) وصححه سليم بن عبيد الهلالي الاثري في كتاب الاذكار برقم (٣٥٨).

خۆتت هێڵابێتەوە لە زانینە نادیارەکاندا کە لای خۆتن ، قورئان بکەی بە بەهاری دڵم ، ڕووناکیی سینگم ، بۆ لابردن و نەهێشتنی نیگەرانیم ، وەدەرنانی خەفەتم).

٦) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( اللهم اني اعوذ بك من الهم و الحزن ، و العجز و الكسل ، و البخل و الجبن وضلع الدين و غلبة الرجال))[1]

واتە : ( ئەی خودامان من پەنات پێدەگرم لەوەی تووشی نیگەرانی و خەفەتخواردن بم ، بەهەمان شێوە پەنات پێدەگرم لەوەی بێدەسەڵاتی و تەمەڵی و تەوەزەلی و چاوچنۆکی و ترسنۆکی ، قەرزباری تەنگم پێ هەڵچنێ ، خەڵکان بەسەرمان زاڵ بن ، تۆ پەنام بدە لەمانە هەمووی ..

٧) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( حسبنا الله و نعم الوكيل ))[2].

واتە : (تەنها خوامان بەسەو خوایش باشترین کەسە خۆمانی پێ بسپێرین).

کاتێك ئەم وشەیە فەرموو تێکڕای حیزب و تیرو هۆزو کافرو مونافیقەکان یەهوودەکانی نێو دوورگەی عەرەب هاتبوون بۆ لە ناوبردن بن بڕکردنی خۆی هاوەڵانی.



[1] لەڕاستیدا فەرمووده (سەحیحە) کەبەم شێوەیە هاتووه (( اللهم اني اعوذ بك من العجز والكسل والجبن والهرم والبخل، واعوذبك من عذاب القبر واعوذ بك من فتنة المحيا والممات)) وفي رواية (وضلع الدين، وغلبة الرجال، اخرجه البخاري برقم (٦٣٦٧) ومسلم برقم (٢٧٠٦)

[2] وعن ابن عباس رضي الله عنة قال (( حسبنا الله ونعم والوكيل) قال ابراهيم عليه السلام حين القي في النار، وقالها محمد وأصحابه حين قالوا (( ان الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم ايماناً وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل)) صحيح اخرجه البخاري برقم ٤٥٦٤ والنسائي في التفسير (١٠١) والحاكم (٢٩٨/٢) دەڵێم بەسە بۆ پیرۆزی ئەم ووشەیە کە پەنا گرتنە بە خودا و لەقورئاندا هاتووەو زمان حاڵی پێغەمبەرو ﷺ یارانی بووە لەکاتی جەنگی ئەحزابدا..

# بەشی دەیەم:

## هەندێك لە تایبەتمەندییەكانی پێغەمبەرﷺ لەسەرتێكڕای پێغەمبەرانیتردا:

## زۆرن تایبە تمەنییەكانی كە پێغەمبەرﷺ لە سەرجەم پێغەمبەرانیتر جیادەكاتەوە:

**لەوانە:**

١. عموم رسالته: گشتی و گشتاندنی پەیامەكەی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی لە رۆژ هەڵات رۆژ ئاوا و باكوورو باشور.( بعث للناس كافة)[1].

٢. موعجیزەی قورئان هەتا دونیادونیایە هیچ پەرتووكێك وەك قورئان ناهێنرێت، با هەموو عیلم زانستەكان بخرێنە گەڕوكار لەم پێناوەدا، قَالَ تَعَالَىَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٣ - ٢٤

٣. ئایینەكەی پارێزراوە، با هەرچەندە دووژمنی زۆر بێت: قَالَ تَعَالَىَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩

٤. تەنانەت خوا وەعدی پاراستنی پێغەمبەری داوە.(قَالَ تَعَالَىَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ ﴾ المائدة: ٦٧

٥. خوا خۆی ئایینەكەی بۆ تەواو كردووە.

٦. نەتەوەكەی چاكترین نەتەوەن ئەگەر پابەندبوونیان بە ئایینەكەیەوە هەبێت.

٧. زۆرترین شوێن كەوتووی هەیە لە دوارۆژدا و لەدەرئەنجامدا .(أكثر الانبياء تبعاً).

٨. ئەم ئایینەی هەر سەكەتووە! با هەرچەندە دووژمنەكانی سەرسەخت بن، دەسەڵاتیان هەبێت.

٩. دووژمن زاڵ نابێت بەسەر ئوممەتەكەیدا ئەگەر خۆیان جیاوازی و دژایەتی وشەڕی یەكتر نەكەن.

---

[1] متفق عليه.

# بەشی پانزەیەم:

## ( بەشی پێشكۆتایی ): هەندێك لە دانپیانانی گەورە دانایان وزانیانی رۆژئاوا بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) :

١) دائیرە مەعریفی بەریتانیا كەدەڵێت:(موحەممەد یەكەم كەس بووە، گۆڕانكاری قوڵ و راستەقینەی لە ناخی خەڵكدا ئەنجامداوە،تا ئیستاو رۆژی ئەمڕۆش لە پەیامی راست دروست و رەوانی بۆ تێكرا خەڵك).

٢) بەرنارد شۆ : كەسێكی وەك (موحەممەد)، ئەگەر حوكم رانی خەڵكی بكات سەر كەتووتووترین كەس دەبێت لە بەرەو پێش بردنی تێكڕای خەڵكی بەرەو ئاشتی هەموو خێرو خۆشیەك كەتێكڕای خەڵكی عەودالی ئەو ئاواتەن).

٣) شاعیری گەورەی رۆژ ئاوا گۆتە: دەڵێت تكام وایە كەسێك بم گەیەنێتە ئەو شارەی كە (مەحەممەد) كۆچ وكاروانی بۆ كردووەچونكە(موحەممەد)ی لێیە.

٤) هەرگۆتە دەڵێت : كاتێك قورئان دەخوێنم ئەوكات هەست دەكەم رۆح وگیانم دەهەژێن .

٥) لیوتولستوی دەڵێت:ئیستا زانیم تەنها پەیامی قورئان شیاوو گونجاوی هۆش و داناییە، هەموو شتێكی تیادا یە كە مرۆڤایەتی پێویستیان هەبێت.

٦) تۆماس كارلیل دەڵێت: تەنها(موحەممەد)ە تێكڕای جیهانی بە نووری عیرفان روون كردووەتەوە، ئەمەش خوا پێی داوە).

٧) جۆرج برناردشۆ(زۆرجار بەڵكوچەندەهاجار ژیانی پێغەمبەرم خوێندووەتەوە، بۆیە بۆم دەركەت پێویستە ناو ببرێت بەرزگاركاری مرۆڤایەتی،هەلەبەرئەوەیە ئەورووپالەم سەردەمەوعاشقی ئیسلام وموحەممەد دەبن بۆ چارەسەركردنی كێشەو گرفتەكانیان.

٨) فارس الخوری: (موحەممەد)گەورەترین مرۆڤیجیهانە بۆ هەمووسەردەمەكان، ئایینەكەشی تەواوترین ئایینە بۆ تێكڕای مرۆڤی سەرزەوی).

٩) ویلز : (هیچ ئایینێكم نەدیوە وەك ئایینی موحەممەد لە گەڵ شارستانیەت و بڕوات پێشەنگ بێت وەك ئیسلام).

١٠) زانای ئەمریكی مایكل هارث دەڵێت: (موحەممەد)تاكە مرۆڤە لە مێژوودا لە هەردوو ئاستی ئاین ودوونیادا سەركەتنی بێوێنەی بەدەست هێناوە،چونكە ئەم ئاستە یەك دەگرنەوە هیچ وێنەی دووبارە نابێتەوەوەك ئەوەی(موحەممەد)پێی هەستاوە).

## بەشی دوانزەیەم بەشی دواییینترینیان:

### راستکردنەوەی عەقیدەو تەوحید ( پەرستن هیوا بەخوا ) بوون.

**لەوانە:**

١) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** اتدری ما حق الله علی العباد؟وماحق العباد علی الله ؟[١]

ماف خوا لە سەر بەندەکانی ئەوەیە بیپەرستن هیچ هاوەڵی بۆ پەیدانەکەن،مافی بەندەکانیش لە سەر خوا ئەوەیە دەرئەنجام بیان خاتە بەهەشتەوە مادەم هاوەڵی بۆپەیدا نەکەن.

٢) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** إن الله حرم علی النار من قال لا إله إلا الله .[٢]

واتە:خوا ئاگری دۆزەخی حەرام کردوە لە سەرئەوکەسەی کەدەڵێت هیچ خوا یەك نییە بەهەق رەوای پەرستن بێت بێجگە لە ئەڵا.

٣) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** یخرج من النار من قال لا إله إلا الله :[٣]

**تەنانەت لە دۆزەخیش دەهێنرێنە دەرەوە مادەم کاریان بە)(لا إله الا الله) کردبێت**

٤) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت** :(( من بطأ به عمله لم یسرع به نسبه))[٤]

**واتە: هەر کەسێ کردەوەی چاکی نەبێت با نەسەبی هەر نەسەبێك هیچ بۆ لای خوای بەرەو پێش نابات.**

٥) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** (یافطمة بنت محمد لا أغني عنك من الله شیئا)[٥]

**واتە : ئەی فاتمەی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) من هیچ قازانجێك بەتۆ ناگەیەنم لە لای خوا ئەگەر تۆ خۆت کاری خوا لە خۆ رازیکردن نەکەیت .**

٦) **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت"** : ((إن الشمس والقمر آیتان من آیات الله یخوف بهما عباده لا ینکسفان لموت أحد ولا لحیات أحد)[٦]

---

[١] متفق علیه.

[٢] رواه مسلم.

[٣] رواه مسلم .

[٤] رواه الترمذي.

[٥] متفق علیه.

[٦] متفق علیه.

واتە: خۆرو مانگ ناگیرێن لە بەر مردن و لە دایك بوونی هیچ کەسێك بە ڵكو ئەوانە نیشانەویە ڵگەی دەسەڵاتی خوایە بەندەکانی پێدەترسێنێ بۆ ئەوەی بگەرێنەوە بۆ خوا) کاتێك ئەم وشەی فەرموو کە ئیبراهیمی کوڕی شیرینی وەفاتی کرد خەڵکی وتیان لە بەروەفاتی ئیبراهیم رۆژ گیران روویداوە !؟.

وەك چۆن ئیستا لە ناو خەڵکدا باوە کاتێك باران دەبارێ دەڵێن پێی قودوومی فلاَن کەسە.

٧) خوا بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت کە بڵێت:﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ﴾ الأعراف: ١٨٨ .

واتە: ئەگەر من عیلمی غەیبم بزانیایە خێرێکی زۆرم دەستی خۆم دەخست، هیچ ناخۆشی خراپەیەکم تووش نەدەبوو!؟.

ئەی تو خوا ئەگەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) عیلمی غەیب نەزانی کەسیتر هەیە عیلی غەیب بزانێ!!!؟ بێگومان نەخێر هیچ کەسێك نییە.

٨) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ماشاء الله وحده )[١]

واتە: تەنها ئەگەر خوا بیەوێ دەبێ.

کاتێك ئەم وشەی فەرموو کابرایەك وتی ئەگەر خوا حەزبکات و تۆش حەزبکەیت؟!

کەواتە وەك ئەمرۆهەندێك خەڵك دەڵێن لە سایەی خواولە سایەی سەری تۆ درووست نییە.

٩) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:من حلف بغير الله فليقل لاإله لا الا الله فإنها كفارة له.

واتە هەرکەسێك سوێندی بێجگە لە ئەڵا خوارد لە دواتربا بڵێت:( لا إله إلا الله)، دەبێتە هۆی سرینەوەی ئەو گوناهە گەورەیە کە سوێند بە بێجگە بەخوا خواردنە.

١٠) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إن الله لايقبل من العمل إلا ما كان طيبا )[٢]

واتە: خوا تەنها شتی خاوێن وەدەگرێت

بۆیە پێویستە بۆ هەموو شتێك تەنها مەبەستت خوا بێت.

١١) من حقق التوحيد دخل الجنة بغير حساب ولاعذاب.

(( وعلى ربهم يتوكلون ))[٣] .

---

[١] رواه احمد وغيره

[٢] صحيح الكلم الطيبظ .

[٣] رواه احمد وغيره.

واتە : تەوحیدو پشت بەستنیان بە خوا هەیە،ئەوەی ئەو کەسانەی بە بێ لێپرسینەوە دەچنە بە هەشت

ئەمەش واتای ئەوەنیە کە هۆکارەکان نەگرێتە بەر. بە ڵکو مەبەست ئەوەیە کە لە گەڵهۆکارەکان پشت هەربەخوا ببەستی،نەك لە خۆی بایی بێت .لە دڵەوە پشت ببە ستی بە هۆکارەکان.

١٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( واعلم أن الأمة لو إجتمعت على أن ينفعون بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك ، وان إجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك))[1] .

واتە : (بزانە ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودمەندت کەن، بە شتێك، سوودمەند نابیت تەنها بە شتێك

نەبێت کە خوا بۆی نووسیبیت. وە ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی زەرەرت پێ بگەیەنن، زیانت پێ ناگات

تەنها بەشتێك نەبێ کەخوا بۆی نووسیبیت لێت ڕووبدات).



[1] پێش ئێستا بەدرێژی لەسەری دواوین صحیحە.

## بابەتە زیادکراوەکانی چاپی دووەم:

ئایا موحەممەد(ﷺ) چی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە؟

لەوەلآمـدا، (١٠)خـاڵ لـە ئامـاژەو تیشـك نـان لـە سـەر ئـەوەی کـە موحەممـەد(ﷺ) پێشکەشی بە مرۆڤایەتی کردووە- بە هۆی پێغەمبەرایەتی و نیگای خواوە- بۆ سەر موحەممەد(ﷺ).

www.mercyprophet.com

بـەڵێ هەنـدێك دەپرسـن گوایـە کـە موحەممـەد(ﷺ) چـی پێشـکەش بـە مرۆڤایـەتی کردووە؟

لەبەر ئەوە وەلآمی ئەمجۆرە پرسیارە لەم ١٠خاڵەدا ڕووندەبێتەوە:

١) ڕێزلێنانی ڕاستەقینەی مرۆڤ بەوەی موحەممەد(ﷺ) کە خەڵکی لە هەموو جۆرە پەرستنێك دەرهێنا -بە تایبەتی لە پەستنی مرۆڤ بۆ مرۆڤ- بۆ پەرستنی خوای تەنها وتاك..لە کاتێکا تا ئەم سەردەمەش ملیۆنەها (بت) پەرست هەن لەوڵاتانی بێجگە ئیسلامی!؟.

٢) موحەممـەد(ﷺ) ڕزگارکـاری هـۆش وبـیری مرۆڤایـەتی کـردووە لـە تێکـڕای ئوسـتوورە-ئەفسـانە-باوەڕنـەکردن بەهـەر شـتێك کـە پێچـەوانەوەی هـۆش و نیگـای خوابێـت وەك ئـەوەی بڵـێن خـوا کـوڕی هەیـە.. هیتر.تـا ئێسـتاش تێکـڕای ئـایین ومەدەنییەتەکان پڕن لەخورافە!؟.

٣) موحەممەد(ﷺ) توانیویەتی دانانی یاسای پێکەوە ژیـان و لێبووردەیی و ئازادی ئایین بچەسپێنێ - هەرکەس خۆی بەرپرسە لە بۆچوون ودیدەکان کە سووکایەتی بە هـیچ ئایینێـك نـەکرێت . (میثـاقی) پەیماننامـەی (مەدینـە) نێـوان موحەممـەد(ﷺ) ویەهوود وبێجگە لەوانیش ..تادوایی باشترین بەڵگەیە.

٤) موحەممەد(ﷺ) سۆزو میهرەبانی خوا بوو بۆ گشت درووستکراوان، کە دەفەرموێ (ﷺ) (خیرالنـاس انفعهـم للنـاس). واتە:چاکترین مـرۆڤ ئەوەیـە کـە سـوودمەنترینیان بێت.

یان(ﷺ) ( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ویده).موسڵمانی راست ئەوەیە تێکرای سەلامەت وپارێزراو بن لەزمان دەستی.یان(ﷺ)(المؤمن من أمنه الناس في أموالهم واعراضهم ودامئةهم) هیتر. باوەرداری راستەقینە ئەوەیە کەخەڵکی باوەڕی پێبهێنن لە ماڵ وگیان و ئابروویان.

٥) موحەممەد(ﷺ) وێنەیەکی لەوپەڕی پرشنگداری پێشکەش کرد لە رێزلێنان لە سەرجەم پێغەمبەران( صلى الله عليهم وسلم) بەبێهیچ جاوازییەك، کە سەرجەم پێغەمبەرانی بەبرای خۆی هەژمارکردوون.( الانبياء إخوة لعلاة وأمهاتهم مختلفة).

٦) موحەممەد(ﷺ) یەکەم چەسپێنەری مافی راستەقینەی مرۆڤی چەسپاند جا بۆ نێرو مێ ومنداڵ و گەورە،

با هەر پێگەیەکی کۆمەڵگایی هەبێت وەك لە حەجی ماڵئاواییدا هاتووە و بێجگە لەویش حەرام کردنی خوێن سەروەت و سامان ئابڕۆی مرۆڤ لە سەریەکتری.

لە پێش ئەم یاسا جیهانیانە:

أ. قانون الشرط الكبير ١٢١٥ز.

ب. وثيقة إعلان الحقوق ١٦٢٨ ز.

ت. قانون تحريرالجسد ١٦٧٩ز.

ث. إعلان الاستقلال الامريكى١٧٧٦ز.

ج. وثيقة حقوق الانسان والمواطن ١٧٨٩ز.

ح. الاعلان العالمي لحقوق الانسان ١٩٤٨ز .

٧) موحەممەد(ﷺ) لایەنی ئەخلاقی بە جێگەوپێگەی شیاوو رەوای خۆی گەیاند (الصدق والوفاء والعفاف، ...) داوای توندو تۆڵکردنی لایەنی کۆمەڵایەتی کرد . بە کردار خۆی دوور بووە و خەڵکیشی قەدەغە کردووە لە درۆو خیانەت پیسکەیی وهەرنا پاکییەك... هیتر.

٨) موحەممەد(ﷺ)هانی خەڵکی داوە بۆ وەگەڕخستن و بەئیشخستنی هۆش وبیر کە پاداشتی خوای لە سەرە لەکاتێکا رۆژئاوا دەینالاند بە دەست خورافەو ئەشکەنجەدانی هەربیرمەندێك نموونە:( چەندەزانا ئەشکەنجەو ئازاردران و کوژران).

هەرئەو وەگەڕخستنەی هۆش وبیرەبوو کەتووانی بۆ ماوەیەکی کەم شارستانیەتی ئیسلامی بەرپاببێت.. نموونەی ئەوشتانەی کەغەرب خۆی بە دانپیانانی خۆی لەشارستانیەتی ئیسلامی وەرگرتووە.

٩) موحەممەد(ﷺ) لەئایین و شەریعەت و یاسای هاوران لە فیترەتی راستەقینەی مرۆڤ لایەنی رۆح ولاشەیی، کاربۆدونیاو دین دەکات.

١٠) تەنها موحەممەد(ﷺ)توانیویەتی برایەتی تەواوی لە نێوان تێکڕای مرۆڤایەتی رابگەینێ شوێنکەتووانی راستەقینەی ئەو پابەندبوونی خۆیانیان پێوە کردووە..وەك دەفەرموێت: (کلکم من آدم وأدم من تراب) :هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لەگڵە (ولا فضل لعربي على عجمي ولالعجمي على عربي) ..واتە هیچ کەسی عەرەب لە هیچ کەسی بێجگە لە عەرەب چاکترنیە، هیچ کەسی بێجگە لە عەرەبیش لە عەرب چاکتر نیە، (ولا فضل لأبيض على أسوَدٍ) هیچ پیست سپییەك چاکترنیە لە پێست رەش، نەپیسترەشیش چاکترە لە پێست سپی، ( إن أكرمك عند الله أتقاكم) ئەو کەستان خۆشەویستە لەلای خوا. خۆی لە قەدەغەیە لێکراوەکان بپارێزێ.

## دووەم بابەتی زیاد کراو لە چاپی دووەم

**ئایا بۆچی خەڵك بانگ دەکەین بۆ باوەڕهێنان بە موحەممەد(ﷺ)؟!**

لە بەر ئەم هۆیانە:

١. چونکە راستگۆ راستکاربووە تەنانەت لە لای دووژمنانی خۆشیەوە. ئەمە خۆی بەسە بۆ باوەڕپێهێنانی!.

٢. هیچ جۆرە درۆیەکی نەکردووە، و لێنەوەشاوەتەوە، جا بۆ گاڵتەو سوعبەتیش بێت.

٣. لە کاتێکا کە دوژمنانی هەموو رێگەیەکیان دەگرتە بەر بۆ ئەوەی درۆیەکی لێبدۆزنەوە

و بلاوی بکەنەوە، لەهەمانکاتدا شتی لەمجۆرە بەهەموو شتێك دەکرا بۆ بەدەست خستنی ئەگەر دەست بکەوتایە، بۆ ئەوەی هەموو دونیای لێتێبگەیەنن!!!!

٤. ئەی چۆن ئەم هەزاران دووژمنە سەر سەختانە ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی تەنها درۆیەکیشی لێنەبینن ئەمە خۆی بەڵگەیە لە سەرا راستگۆیی ئەو زاتەمحمد(ﷺ).

٥. سەرەرای ئەوەش تێکرای یاساو شەریعەتەکەی کەپێی هاتووە تائیستا بچووکترین درۆو هەڵە لێنەگیراوەولێناگیریّ!

٦. ئەو هەموو ئیعجازی عیلمی وزانستیانەی کەپێی هاتووە.

٧. ئەو وەعدو پەیمانانەی کە بەخەڵکی داوە کە سەردەکەویّ.

٨. وەك چۆن پاسەوانی خۆی بەرێکردنەوە ماڵ لە گەڵ هەموو دووژمنە سەرسەختانەی ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ المائدة: ٦٧ .

لە گەڵ بوونی ئەو هەموو دووژمنە لە یەهود و عەرەبی نسرانی و فارس مونافیقش ..

٩. تەنانەت قورئان خۆی تەحەددای بۆ تێکرا مرۆڤ تیادایە هەتا دوایین مرۆڤ بتوانی نموونەی سورەتێك بهێنێت!!! ئەمەش بەسە بۆ راستێتی محمد(ﷺ).

١٠. هیچ شتێکی لێبەسەرنەهاتووە وەك گۆڕین وتێکچوون لە( ئەقل) هۆش بیرو رەوشت و لێبوردەیی...ئەم هۆیانەو سەدان و هەزاران بەڵگەی تر هەی بۆ راستێتی ئەم موحەممەدە(ﷺ) بۆیە باوەڕمان پێهیناوەو داوای لە تۆی هۆشمەندیش دەکەین بۆ باوەڕهێنان بە موحەممەد(ﷺ)ی راستگفتاروکردار.



# پێرست

# ساتێك بۆ ناسینی موحەممەد 



ئەم نامیلکەیە ئەم بابەتانە لە خۆدەگرێ:

بەشی یەکەم : بۆ ناسینی هەرکەسێك پێویستە بگەڕێینەوە بۆ وتەکانی:

بەشی دووەم:موحەممەد ﷺ بە کردار سەلمانوویەتی کە نموونەی تەواوی مرۆڤایەتیە:

بەشی سێیەم: ڕەوشت بەرزی وجوانی و تەواوی پێغەمبەر ﷺ.

بەشی چوارەم: وەسێتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کەسانەی تووش بوون بە بەڵاو موسیبەت، چونکە مرۆڤ کەهاتە دوونیاوە خۆشی و ناخۆشی دەبینی بۆیە پێویستە ئەم ئامۆژگاریانە وەرگرێت لە پێغەمبەر ﷺ .

بەشی پێنجەم : گەشەپێدان و پەرەپێدانی مرۆیی :بێگومان ئەمڕۆ چەندەها زانکۆ و دیراسات تەرخان کراوە بۆ ئەمە مەبستە، بۆیە وەك نموونە هەندێك خاڵ وئاماژەی پێغەمبەر ﷺ باس دەکەین وەك دڵۆپێك لە دەریای بێپەی موحەممەددا ﷺ

بەشی شەشەم:گەورەیی پیرۆزی پێغەمبەری خوا موحەممەددا ﷺ...

بەشی هەشتەم : سوودوبەرەکەتی سلأواتدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ زۆرن:

بەشی نۆیەم : چێژ وەرگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە موناجات و پەیوەندی ڕاستەوخۆو پاڕانەوەی بۆ لای خوا:

بەشی دەیەم:هەندێك لە تایبەتمەنییەکانی پێغەمبەرﷺ لە سەر تێکڕای پێغەمبەرانیتردا: زۆرن تایبەتمەنییەکانی کەپێغەمبەرﷺ لە سەرجەم پێغەمبەرانیتر جیادەکاتەوە:

بەشی یانزەیەم: ڕاستکردنەوەی عەقیدەو تەوحید (پەرستن هیوا بەخوا) بوون.بەشی سیانزە

بەشی دووانزە : ١٠خاڵ لە ئامارەو تیشك نان لە سەر ئەوەی کەموحەممەد پێشکەشی بە مرۆڤایەتی کردووە.

بەشی سیانزە: بۆچی خەڵك بانگ دەکەین بۆ باوەڕهینان بەمحمد(ﷺ)؟الەبەر ئەم ١٠هۆیانە:

بۆ هەر سەرنج و تێبینییەك پەیوەندی بکەن بەم ژمارە
( ٠٧٥٠٣٤٩٩٠٣٧ )

رقم الأيداع المكتبة العامة أربيل ٩٨٥/٢٠١٢

چاپخانەی ڕۆژهەلات/هەولێر